# دەمارگیری حیزبی

**گرنگترین کێشەو گرفتی بزووتنەوەو بزاڤی ئیسلامی**

د. مصطفی بەدری

---

لە صحیحی بوخاری دا هاتووە: "أن رجلين من المهاجرين والأنصار تشاجرا فَقَالَ الأَنْصَارِي يَا لَلأَنْصَارِ، وَقَالَ الْمُهَاجِرِي يَا لَلْمُهَاجِرِينَ''، فَسَمِعَ ذَاكَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ ''مَا بَالُ دَعْوَى جَاهِلِيَّةٍ؟!''، قَالُوا ''يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأنصار''، فَقَالَ ''دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ".

- کە دوو دانە ئەنسارِی دەبێتە دەمەقاڵێیان، ئەنسارییەکە هاوار دەکات دەڵێ؛ هۆ ئەنسارەکان، موهاجیرەکەش دەنگ هەڵدەبڕێ ودەڵێ؛ هۆ موهاجیرەکان، پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - گوێی لێ دەبێ، دەفەرمێ: "خەبەر چییە بانگی جاهیلیەتتان تیا بەرز بۆتەوە ؟! "، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ، موهاجیرێك لە ئەنسارییەکی داوە، فەرمووی: "لێی گەڕێن بۆگەنە ئەمە" ! -

سەیر لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - پێیان دەفەرموێ: "خەبەر چییە بانگی جاهیلیەت بەرز بۆتەوە ؟!"، دیارە کە موهاجیر وئەنسارەکان لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەردا - صلی الله علیه وسلم - ستایشێکی زۆریان کراوەو، لە هەمان کات ئەوان زیاتر لە بانگ ودەنگ هەڵهێنانێك هیچی تریان نەکردبوو ، بەڵام چونکە بانگ ودەنگ هەڵهێنانیان

لەسەر بنەمای دەمارگیری ولێك جیاكردنەوەی موسوڵمانان بوو پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ناوی نا "بانگی جاهیلیەت".

ئەم دەردە كوشندەیەش گەورە دەردی بزووتنەوەو بزاڤە ئیسلامییەكانە لەم سەردەمە هاوچەرخەدا. لە كاتێكدا كە ئەو حیزب وبزووتنەوەو جەماعەتە هاوچەرخانە لە ئەسڵدا بۆ ئەوە دروستكراون خزمەت وسوود بە ئوممەت بە گشتی بگەیەنن، بەڵام بە درێژایی كات كەوتنە نێو گۆڕانكاری وگۆڕانیان بەسەردا هات وبوونە خەنجەرێك كە لە پشتی ئەم ئوممەتەدا چەقیوە، ئەویش بە هۆی ئەو دەمارگیرییەی ڕۆڵەكانیان لەسەری پەروەردە دەبن وسەرەنجام بە پەرتەواز بوون ولێك جیا بوونەوەو ململانێ دەگات .. ئەمەش لەو كاتەدایە كە ئوممەت ئەوپەڕ پێویستی بە یەكیەتی ولێك نزیك بوونەوەو برایەتی هەیە ! وێڕای ئەوەی هیچ گروپ وجەماعەتێك نییە ئەمڕۆ بڵێت ئێمە هەمان فەزڵ وپلەو پایەی موهاجیر وئەنسارەكانمان هەیە، ئەگەرچی كە ئینكاری هەوڵ وتەلاشی ئەو بزووتنەوەو بزاڤانە لە زۆرێك لایەن وبواردا ناكەین، كە زەحمەتە لێرەدا كۆیانكەینەوەو بیانخەینە ڕوو.

سەرباری ئەوەی كە وتاری گشتی ئەم جەماعەتانە نەفەسی ئەوە لە خۆ هەڵدەگرێت كە هەڵەو خەتاكردن شتێكی سروشتییەو ئەگەری هەیە بێتو، هەموویان ئەو وتەی ئیمامی مالیك دووبارە دەكەنەوە كە دەفەرموێت - ڕەحمەتی خوای لێبێ: (كُلٌّ يؤخذ من قوله ويُرَدّ إلا صاحب هذا القبر – عليه الصلاة والسلام) - هەرچی مرۆڤێك قسەكانی وای هەیە وەردەگیرێنو وای هەن ڕەت دەدرێنەوە، مەگەر خاوەنی ئەم قەبرە - دروود وسڵاوی خوای لێبێ - ؛ بەڵام واقیعە پراكتیكی وعەمەلییەكە دەڵێت: "ئێمە پاكین لە هەڵەو .. خەتا ناكەین" !

بەو ئەندازەی كە زۆرێكیان تیایە خێرا بەرەو سەلماندنی وتەو ڕایەك یا كردارێك دەڕوات كە بە خەیاڵی خۆی گروپەكەی یا كەسێك لە سەركردەكانی ئەو گروپە دەریانخستووە،

کەچی کاتێك جەماعەت وسەرکردەکانی جەماعەتەکەی خۆی خۆیان لەو ڕایە یا لەو کردارە بەری دەکەن یا دەردەکەوێ ئەوان نین ئەنجامیان داوە دەبینی هەمان کەس دێتەوەو پێچەوانەی وتەی یەکەمی دەسەلمێنێت وپاساو وبیانووی بۆ دێنێتەوە ! لە دیمەنێکدا کە بەرزترین ئاستی دەمارگیری مەزهەبی دێنێتەوە بەرچاوی مرۆڤ، کە مەزهەبییەکان کەسانێکیان تیا بوو دەیانوت: "هەر دەقێك، چ قورئان یا سوننەت؛ پێچەوانەی مەزهەبی ئێمە بێت .. دیارە کە مانای تری هەیە، یا حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوەو هەڵگیراوە" !

اِبنُ القَيِّم - ڕەحمەتی خوای لێبێ - لەم مەسەلەدا دەڵێت: "کاتی خۆیەتی لایەنگران وکۆمەڵی خوای پەروەردگار لە هەرچی ئەمر وفەرمایشتی خوایە ترسی کەس نەیانگرێت وخۆیان بە لای کۆمەڵێکی تایبەتەوە نەدەنو، هەر وتەیەکی حەق هەیە بیکەنە ئامرازی پشتیوانی خواو پێغەمبەرەکەی - با هەر کەسێك بێ ئەو قسەی لێوە دەرچووبێت - هاوشێوەی ئەو کەسانە نەبن تایفەو گروپەکەیان هەرچی بڵێن ئەویان پێ پەسەند بێت وهەرچی بەرامبەر وتایفەکانی تر بڕوایان پێی بێ ڕەتیکەنەوەو قبووڵیان نەبێت، کە دیارە ئەوە ڕێباز ومامەڵەی دەمارگیران وخاوەن حەمیەتی جاهیلیەت وسەردەمی نەفامییە".

ئەگەر ئەمەش حاڵی ئەو بزاڤە ئیسلامییە بێت کە لە ڕۆڵی پێشەنگی وسەرکردایەتی کۆمەڵانی ئوممەتدایە، ئەوا ئەم پرسە لە نێو موسوڵمانانادا بە گشتی دیمەنێکی زۆر تاریکتر لەخۆدا دەگرێتو، چ لە دەمارگیری عەشایەری وقەبەلیدا بێ یا دەمارگیری نەتەوەیی وتا دوایی، ئەوەتاش حاڵی جەماوەری وەرزشی وهاندەرانی یانەکانی تۆپی پێ شاراوە نییەو لە بەرچاوی هەموواندایە !

مەبەستیشم نییە لێرەدا زۆر لە وەسف ودەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەدا ڕۆچم، چونکە هەر کەس ئاگاداری وەزع وحاڵ وباری ئوممەت بێت ئەم حاڵەتەشی لا ئاشکرایە، بەڵکو

زێدەڕەویم نەکردووە بڵێم ئەم دەردە هۆکاری سەرەکی تەواوی ئەو سەرشۆڕی وزیلەت ولاوازییەیە ئەمڕۆ موسوڵمانان تێپەڕی دەکەن وتێیدا دەژین، لە حاڵەتێك کە ململانێی دەسەلآت وپێشڕەوی لە نێوان موسوڵمانان ودوژمنانی دینەکەیان نەماوەتەوە، بەڵکو کەوتۆتە نێوان حیزب وجەماعەتە ئیسلامییەکانەوە لە نێوخۆدا ، هەموو سەرەڕای ئەوەی کە خوای پەروەردگار بە ڕوونی ئاگاداری کردووینەتەوە کە فەرموویەتی: {وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ} - ئاشووب و ئاژاوە مەگێڕن و مەچن بەگژ یەکدا ، خۆ ئەگەر بچن بەگژ یەکداو یەکتر بشکێنن، ئەوە شکست و لاوازی ڕووتان تێدەکات و هەیبەت و شکۆداری و دەسەلآتتان لەبەین دەچێت -، بەڵکو دەردەکە گەشتۆتە ئەوەی کە لە ناو یەك جەماعەتدا خەڵك شەڕ لەسەر پێشڕەوی وسەرکردایەتی دەکەن ودەبێتە ململانێیان !

بۆیە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - هەر لە سەرەتای هاتنی بۆ مەدینەوە هەوڵیدا موهاجیر وئەنسارەکان بکاتە برای یەك، وپەیوەندیو وابەستەی بڕواو عەقیدەت لە نێوان ئەوس وخەزرەجدا بچەسپێنێت، بۆ ئەوەی وەك پارێزەر وچاودێری ئەم کۆمەڵگە مەدەنییە تازەیە بێت نەوەك تووشی ئەم دەرد وئافەتە مەترسیدارە بێتن.

ئەوەی لێرەشدا جێگەی بایەخە بۆم - سەرەڕای ئاڵۆزی وفراوانی بابەتەکە - وەسفی چارەسەر وگەڕان بە دوای ئامرازەکانی چاك بوونەوەدایە لەم دەرد ونەخۆشییەو، هەوڵ ئەدەم لە چەند خاڵێکدا بە پوختی بیخەمە ڕوو:

١- پەروەردە کردنی نەوەی تازە پێگەیشتووی ئەم بزاڤ وتەوژمانە لەسەر پێویستی وبایەخو واجبی یەکیەتی ئوممەتو وابەستە بوونی بە یەکەوەو، ئەوەی کە بلآوکردنەوەی یەکخواپەرستی ولەخواترسی لە زەمیندا پەیوەست بە یەکیەتی ئوممەتی ئیسلامە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ} - بەڕاستی ئەم ئایینەی

که ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە ئایینەکەی ئێوەیە، که یەك ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن - ؛ هەروەها دەفەرموێت: {وَإِنَّ هذه أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ} - هەر ئەمەشە دین و ئاین و بەرنامەی تاکو تەنهای ئێوە، (بەرنامەی یەکخواناسی)و من پەروەردگارتانم، پارێزکاربن و خۆتان لە نافەرمانی من بپارێزن.

٢- دووپاتکردنەوەی ئەو مانایەی لە وتەی پەروەردگاردا هاتووە که دەفەرموێت: {إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ} - بێ گومان بڕواداران برای یەکترن - ؛ هەروەها ئەوەی که پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - دەفەرموێت: "الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ" - موسوڵمان برای موسوڵمانە -، هەروەها ئەوەی که گروپ وبزووتنەوەو بزاڤ یاخود ڕێکخراو "کۆمەڵ وجەماعەتێکە لە نێوان موسوڵمانان" دا و "جەماعەت وکۆمەڵی موسوڵمانان" نییەو - واتا هەر خۆیان بە تەنیا موسوڵمان نین -، ئەندامی ئەو بزاڤانە بە پێی لینکەکانی عەقیدەت وبیر وباوەڕەوە وابەستەی ئەندامانی ئوممەتی ئیسلامن بە گشتی - که مافە تەواوەکانی ئەو وابەستە بوونەیان بۆ فەراهەم دەکات.

٣- بیرخستنەوەی بەردەوامی ئەوەی که موسیبەت وناخۆشی هەر تاك وکۆمەڵێکی تری موسوڵمانان لە ڕاستیدا ناخۆشی وناڕەحەتی وبەڵای تەواوی ئوممەتە، هەر وەك چۆن ئێش وئازار بەوان دەگەینێت ئازاری ئێمەش ئەداتو، ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە وتەی پەیامبەردا دیارە - صلى الله عليه وسلم - که دەفەرموێت: "مَثَلُ المؤمنين في تَوَادِّهم وتراحُمهم وتعاطُفهم.. مثلُ الجسد، إذا اشتكى منه عضو تَدَاعَى له سائرُ الجسد بالسَّهَرِ والحُمّى" - ئیمانداران لە سۆز وبەزەیی وڕەحمیان بەرامبەر یەکترەوە .. وەك یەك جەستە وان، هەر کات ئەندامێکی ئێش وئازاری بێت تەواوی ئەو جەستەیە ناڵەی لێ هەڵدەستێتو خەو لە چاوی دەپەڕێو تا دەیگرێت.

٤- بڵاوكردنەوەی لێ حاڵی بوون وچەمكی دروستەی سەرخستن وكۆمەك وپشتیوانی كردنی براو برادەر وخۆشەویست، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا، فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ، قَالَ تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنَعُهُ مِنْ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلِكَ نَصْرُهُ" - براكەت ستەمكار یا ستەملێكراو بوو تۆ هەر سەریخە ! پیاوێك گوتی: پێغەمبەری خوا ، ئەوە كە ستەملێكراو بوو سەریدەخەم بەڵام كە ستەمكار وزاڵم بوو چۆن سەریخەم، فەرمووی: دەستی لە ستەم وزوڵم دەگریتەوەو بەم شێوەیە تۆ سەرتخستووە وپشتیوانی بوویت !"، نەك بەوەی تۆ لە هەر حاڵەتێكدا دەمارگیر بیت بۆی !

٥- بزانین كە لاواز بوونی دۆستایەتی تەواوی نێوان ئەندامانی ئیماندار هۆكاری بڵاوبوونەوەی فیتنەو فەساد وگەندەڵییە لە زەویدا ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ} - ئەوانەش كە بێ باوەڕ بوون، هەندێكیان پشتیوانی هەندێكی تریانن وپشتیوانی لە یەكتر دەكەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار وا نەكەن - واتا كۆمەك بەیەكتر نەكەن وپشتی یەكتر نەگرن - ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی وناكۆكی وگوناه وتاوانی گەورە پێش دێت - .. شێخ شعراوی - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرمێ: "كافرانیش - وەك ئەزانین - وهەر وەك چۆن ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەگێڕێتەوە یەك هاوەڵی یەكترە، بۆیە گەر بڕواداران وابەستەی یەك نەبن وبە یەك دڵ كۆنەبنەوە، ئەوە كافران بە سروشتی كوفر ودوژمنایەتییان بۆ ئیسلام كۆدەبنەوەو لە یەك نزیك دەبنەوەو، كە موسوڵمانان بە وابەستە بوونیان بە یەكەوە كۆنەبوونەوە ئەوە دەبینین چۆن خوای پەروەردگار كە حەقە هەڕەشەیان لێدەكات وئاگاداریان دەكاتەوەو دەفەرموێت: {إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ} - كە وا نەكەن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی وناكۆكی وگوناه وتاوانی گەورە پێش دێت.

خوایە؛ ڕیزەكانمان یەكخەیت ودڵەكانمان ئاشت كەیتەوەو بەسەر دوژمنی خۆت ودوژمنی خۆماندا سەرمانخەیت.

